| | | |
|---|---|---|
| R. Gum | طفح حطاطي أحمر في الأطفال | جۆرە لیردەردانێکی سوورە لە ساوادا |
| Redecussate | يكر التصالب | یەکتر بڕینەوە: جارێکی تریش خاچوار یەکتر بڕینەوە |
| Redintegration | اصلاح، ترميم | چاکسازی، چاک کردنەوە: خستنەبریی بەشێکی (ئەندامێکی) بزر یان نەماو |
| Redislocation | إعادة (كر) الخلع | لە جێ چوونەوە: جارێکی تریش لەجێ چوون |
| Redox | اختزال وتأكسد متبادل: تفاعل أختزالي تأكسدي | کەمبوونەوە و ئۆکسانی بەرامبەر: کارلێک کردنێکی کەمبوونەوەیی و ئۆکسیدێنی (ئۆکسانی) |
| Redressement | ١- اعادة التضميد<br>٢- التعويض عن قسم أو تصحيح تشوه | ١- تیمار کردنەوە<br>٢- خستنەوە جێی بەشێك یان ڕاستکردنەوە و چاکردنەوەی ناڕێکییەك |
| R.Force | تجبير (تصليح) قسري | بە زۆر گرتنەوە (چاك کردنەوە) |
| Reduce | ١- يرجع (الى موضع أو علاقة سابقة اعتيادية)<br>٢- يختزل<br>٣- ينقص الوزن | ١- گرتنەوە، خستنەوە سەربار (ی پێشو، جێی ئاسایی وەك گرتنەوەی شكاوی.. هتد)<br>٢- (لە کیمیادا) کەمبوونەوە کەمکردنەوە، لێکردنەوە<br>٣- لە کێش (قورسی) کەمکردنەوە (سووکبوون) |

| | | |
|---|---|---|
| Reducible | ١- قابل للرد (ارجاع)<br>٢- قابل للأختزال | ١- دەشێت بگیرێتەوە، دەگیرێتەوە<br>٢- دەشێت کەمکرێتەوە، کەم دەکرێتەوە |
| Reduction | ١- تجبير، ارجاع، رد<br>٢- (في الكيمياء) أختزال | ١- گرتنەوە، خستنەوە جێ (ی شکاوی، لە جێچوون)<br>٢- (لە کیمیادا) کەمبوونەوە، کەمکردنەوە ئۆکسجین لە، یان هایدرۆجین خستنەسەر ماددەیەك و بەگشتی کەمبوونەوەی بارگەی پۆزەتیف یان پەیدابوونی بارگەی نێگەتیف |
| Reductant | مختزل | لێکەرەوە، کەمکەرەوە |
| Reduplication | تضاعف، مضاعفة | دوو هێندەبوون دوو جار کردن (بوون):<br>١- دوقەد کردن، نوشتانەوە سەر..<br>٢- دووجار بوونی بەش |
| Redwater = Braxy | جمرة الغنم | تیراوێی مەڕ |
| Reed | قصب | قامیش، نەی، زەل |
| Reed's cells | خلايا (ريد) | خانەکانی (رید): جۆرە تەنیلەی قاشقاشی زلە کە گەردیلەی نارێك و پەرشی کرۆماتینی تێدایە لەگەڵ یەك یان دوو ناوکۆڵە (meleolus) لەناو لیمفە لوودا بەرچاو دەکەوێت لە نەخۆشی (هۆجکن)دا |

| | | |
|---|---|---|
| Re-education | تأهيل | شايستاندن، ڕاهێنانەوە: مەشقپێکردنی کەسێکی پەك کەوتە یان هۆشی نارێك بۆ هێنانەوەی بۆ سەر باری جارانی ئەگەر بشێت |
| Rees's Test | أختبار (ريز) | تاقی کردنەوەی (ڕیز): بۆ ئەلبۆمین: نیشاندنی ئەلبۆمینە (ئەگەر هەبێت) لە گیراوەیەکدا بە هۆی گیراوەی کهوولی ترشی تانیکەوە |
| Refect | يشفى، يصلح، يرمم، ينعش | بووژنەوە، چاکبوونەوە، چاك کردنەوە |
| Refection | انعاش، شفاء، تصليح، ترميم | بووژانەوە، چاکبوونەوە، چاك کردنەوە: بەتایبەتی نەمانی خوویەکی نیشانەکانی ڤیتامین (B) کەمی لەو مشکانەدا کەلە سەر خۆراکی کەم ڤیتامین پەروەردە کراون |
| Refine | ينقي، يكرر: يصفي ويزيل المادة الغريبة عن.. | پالاوتن، فالکردن |
| Refinement | تنقية، تكرير | پالاوتن، فالکردن |
| Refinery | مصفاة، معمل تكرير | پالێوگە |

| | | |
|---|---|---|
| Reflected | منعكس | دراوە، گەڕاوە، ڕەتەوەبوو |
| Reflection | انعكاس | دانـــــەوە، ڤـــــەدان، ڕەت بوونەوە، گەڕانەوە |
| R. Angle | زاوية الأنعكاس | گۆشەی دانەوە |
| Reflector | عـاكس، مـرآة: جهـاز لعكـس الصوت أو الضوء | ڕەتكـــــــەرەوە،.... دەرەوە، ئاوێنـــە: ئامێرێكـــە بـــۆ ڕەتكردنـــەوە (دانـــەوە)ی ڕووناكی یان دەنگ |
| Reflex | منعكس | ١- دراوە، ڕەتەوە بوو<br>٢- پەرچەكردار فرمان یـان جووڵە<br>٣- وێنەیــــــــەكی دراوەی شتێك |
| R.'s Abdominal | منعكـــــسات بطنيــــــة أو منعكسات البطن | پەرچـە كردارەكـانی زگ: كرژبـوون لـە دەوروبـەری نـاوك بـە تونـدی دەسـت لێخشاندن لە دیواری زگ |
| R. Arc | القوس الأنعكاس | كەوانی پەرچەدار، پەرچـە كەوان |
| R., Accommodation | منعكس التكيف | پەرچـــەكرداری ڕاهێنـــان (ڕاهاتن) |
| R., Ankle, = Ancle Clonus | منعكس الكامل | پەرچە كرداری قولە پـێ |
| R., Babiniski's | منعكس (بابنسكي) | پەرچـە كـرداری (بابنـسكی): بەختووكـەدانی بـەری پـێ بـۆ پـشتەوە نوشـتانەوەی پەنجـە گەورەی پێ لـە زیـان گەیـشتن بە پۆپتیژە ڕێبازدا دەبێت |

| | | |
|---|---|---|
| R., Behaviour = Conditromed | **منعكس سلوكي** | **پەرچە کرداری ڕەفتاری** |
| R., Biceps | **منعكس ذات الرأسين** | **پەرچە کرداری ماسولکە دوو سەرە: کرژبوونی دوو سەرە ماسولکەی باهو بەکێشان بەژێیەکەیدا** |
| R., Carotid Sinus | **منعكس الجيب السباتي** | **پەرچە کرداری گیرفانی کارۆتید: بەتوندی دەست نان بە گیرفانی کارۆتیدا دەبێتە هۆی خاوکردنەوەی خێرایی دڵ** |
| R., Chain | **منعكس مسلسل** | **زنجیرە پەرچە کردار، پەرچە کرداری زنجیرەیی: زنجیرە پەرچە کردارێکە هەر یەکێکیان کاری دنەدەر بۆ ئەوەی دوایی دەکات و چالاکییەکی تەواو دەنوێنێت** |
| R., Conditioned | **منعكس مشروط (شرطي)** | **پەرچە کرداری مەرجدار: جۆرە پەرچە کردارێکە بە خۆڕسك (جۆری سروشتی) لە گیانلەبەردا نابێت بەڵام دەشێت دروست بکرێت بە بەندکردنی فرمانێکی فیزیۆلۆجی بە کردارێکی دەرەکی بێ پەیوەستی وەك زەنگ لێدان یان ڕووناکی یەك و گورج لەگەڵ زەنگەکە یان ڕووناکی دەرکەوتن فرمانە فیزیۆلۆجییەکە دەست پێ دەکات** |

| | | |
|---|---|---|
| R., Corneal | منعكس القرنية | پەرچەكردارى گلێنە (ى چاو): هەژاندنى گلێنە دەبێتە هۆى چاو نووقاندن |
| R., Deep | منعكس عميق | پەرچە كردارى قووڵ، قووڵە پەرچەكردار: هەچ پەرچە كردارێ كە پەيدا ببێت لە دنەدانى پێكهاتوويەكى ناوەوە (قووڵ) |
| R., Delayed | منعكس متأخر، منعكس معوق | پەرچە كردارى دواكەوتوو (وەدرەنگ كەوتو): ئەوەيە كە ماوەيەك دواى بەكارهێنانى (كاركردن)ى دنەدەركە پەيدا دەبێت |
| R., Faucial | منعكس حلقي | پەرچە كردارى گەرو: خوراندنى گەرو دەبێتە هۆى ڕشانەوە |
| R., Gluteal | منعكس الوي | پەرچە كردارى سمت: بە كێشان بەپێستى سمتدا ماسولكەكانى سمت كرژ دەبن |
| R., Gasp | منعكس القبض | پەرچە كردارى گرتن: پەرچە كردارێكە وەك بۆ گرتن لە پەنجەكانى دەست يان پێدا دەبێت بە دنەدان |

| | | |
|---|---|---|
| R., Laryngeal | منعكس حنجري | پەرچــە کــرداری قــوڕگ: هەژانــدنی گـەرو و قـوڕگ دەبێتە هۆی کۆکین |
| R., Knee jerk | منعكس نفضة الركبة | پەرچــە کــرداری ئــەژنۆ ڕاتەکین |
| R., Light | منعكس الضوء | پەرچـە کـرداری ڕووناکی: کرژبــــوون (بــــچووك بوونــەوە)ی بیبیلــە کــە ڕووناکی بەردەکەوێت |
| R., Patellar=Kneejerk n., | منعكس رضفي (الرضفة) | پەرچــە کــرداری کـلاوەی ئەژنۆ |
| R., Psychic | منعكس نفسي (نفساني) | پەرچـەکرداری دەروونــی: پەرچــە کردارێکــە دێتــە قەومان بەهۆی شوێنەواری عــەمار کــراوی یــاد، وەك لیـك بەردەوامـدا هاتنـەوە لەبەر ناو هێنان یان دیتنی خواردەمەنێکی خۆش |
| R., Radial | المنعكس الكعبري | پەرچە کرداری کەوەرە: بە کێشان بەسـەری خـواروی کـــــەوەرەدا باســـــك دەنوشتێتەوە سەر باهو لـە ئەنیـــــشکدا و ڕەنگـــــە پەنجەکانیش کرژبن |
| R., Tendon = peep n. | منعكس وتري | ژێیە پەرچە کردار |

| | | |
|---|---|---|
| R., Trained = Conditioned n. | منعكس تدريبي | مەشقە پەرچە کردار |
| R.,Vagus | منعكس العصب التايه | پەرچە کرداری ڕەگە گەڕۆك: هەستیارییەکی نا ئاسایی بۆ دەست پیانان بەسەر ئەو وێنانەی ڕەگی دەیەمی کاپولی (lth nerve) بەژێردا دەڕوان، ئەم بارە لە نەخۆشی سیلدا دەبێت |
| Reflexa = Decidua reflexa | الساقط المنعكس | کەوتوی گەڕاوە (بەشێکە لە ئاوەڵی منالّ) |
| Reflux | جزر، ارتداد | نیشتاو: گەڕانەوە دوا |
| Reformatory | اصلاحية | چاکسازی |
| Refract | ١- يكسر (شعاع الضوء)<br>٢- يحدد قوة الأنكسار (في العين أو العدسة) | ١- شکانەوە (ی تیشکی ڕووناکی)<br>٢- هێزی شکانەوە دۆزینەوە (لە چاودا یان لە هاوێنە (عدسە)دا) |
| Refracta dosi | بمقادير جزئية (مقسمة) ومتكرره | کەم کەم و پەیتا پەیتا: بەبڕی کەمی (دابەشکراو) و پەیتا پەیتا |
| Refraction | انكسار | شکانەوە: لادان (گۆڕانی سەحت)ی تیشکی ڕووناکییە کاتێك بە شێوەیەکی لار بەناو دو ناوەنددا دەڕوات لە ڕووناکە چڕییەکانیان جیاواز بن |

| | | |
|---|---|---|
| R., Double | **انکسار مزدوج (مضاعف** | **جـووت شـکانەوە: ئەوەیــە کــە تێــدا تیــشکی لێــدەر (incident ray) دابـــەش دەبێت بـەدو تیـشکی دراوە (reflected ray) وە بـــۆ دروســــتکردنی دووێنـــــە جـووت شـکانەوە بـــەهۆی ئایـسلاند سـپارەوە دەبێـت بنوارە** nicol prism |
| R., Dynamic | **انکسار حرکي** | **شـــکانەوەی دینــــامیکی: ڕاهێنانە ئاساییەکەی چاوە کە یەکبینە دەکرێت بـەبێ ئـــەوەی پێـــی بزانرێـــت (کەســەکە خــۆی هەســتی بکات)** |
| R., Ocular | **انکسار بصري** | **بیناییــــــە شــــــکانەوە، شـــــکانەوەی بینــــــایی: شــکانەوەی ڕوونـــاکی کـــە بەهۆی ناوەنـدەکانی چاوەوە دەکرێــت و ئــەنجامی وێنـــە خستنە سەر تۆڕی چاوە** |
| R., Static | **انکسار ساکن** | **ئـارام شـکانەوە، شـکانەوەی ستاتی (مەنگ): شکانەوەی ڕوونـــاکی لـــە چـــاودا لـــە کاتێکا کـە ڕاهـاتنی شـەپۆلە دارە (شەپۆلەی لێداوە)** |

| | | |
|---|---|---|
| R., Index of | معامل الأنكسار | هاوكۆلكـــەی شــــكانەوە: رێــژەی نێــوان خێرایـــی ڕوونـــاكی لــە بۆشـــاییدا و خێراییەكـــەی لـــە هـــەر ناوەندێكدایە |
| Refractionist | فاحص النظر | ڕیفراكشنیـست، چاوپـشكن: كەســـێكی پـــسپۆر لـــە دۆزینـــــەوەی هێـــــزی شـــــكانەوەی چـــــاوان و ڕاســـتكردنەوەی خەوشـــی بینـــــایی (هەڵـــــەكانی شكانەوە) |
| Refractive | ١- انكساري<br>٢- كاسر | ١- شكێنەوەیی<br>٢- شكێنەوە |
| Refractivity | الأنكسارية | شكێنەوەیی |
| Refractometer | مقياس الأنكسار | شــكانەوە پێــو، پێــوەری شـــــكانەوە، (ریفـــــر اكتۆمیتەر):<br>١- دەزگایەكــە بــۆ پێوانــە كردنــی هێــزی شــكانەوەی چاو<br>٢- دەزگایەكـــــە بـــــۆ دۆزینـــەوەی هاوكۆلكـــەی شـــــكانەوەی مـــــاددە جیاوازەكان |

| | | |
|---|---|---|
| Refractometry | قياس الأنكسار | پێوانی شکانەوە، شکانەوە پێوی |
| Refractory | عصي | لاسار، یاخی: بە ئاسانی چارە ناکرێت |
| Refracture | اعادة (كر) الكسر | شکاندنەوە: شکاندنەوەی ئێسکێکی شکاوی خۆ گرتووەوە بۆ ڕاستکردنەوەی خواری |
| Refrangible | قابل للأنكسار | شکستەنی، دەشکێتەوە، دەشێت بشکێتەوە وەك تیشکی ڕووناکی |
| Refresh | ينعش | بووژاندنەوە، تازە کردنەوە، ڕووت کردن لە بەرگی، ڕووشاندن |
| Refresher | منعش | بووژێنەوە، تازە کەرەوە: بیرخەرەوە |
| Refrigerant | مبرد، ملطف | ١- فێنك کەرەوە (دەرمان)<br>٢- تاو تێنوێتی پەڕین (لابەر) |
| Refrigeration | تبريد | سارد کردن، تەزاندن: وەك دەرمان بەکارهێنانی ساردی بۆ نەخۆشی |
| Regel | الحيض | مەهك، حەیز، بێنوێژی، عوزر |

| | | |
|---|---|---|
| Regemeration | تجدد | نوێبوونەوە، تازە بوونـەوە: تـــازە بوونـــەوە یـــان چـــاکبوونەوەی شـــانەی فەوتاو |
| Regimen | حمية | پارێز، (ریژیم) |
| Regio = region | منطقة | ناوچە، هەرێم |
| Region | منطقة | ناوچـــە: هـــەچ بەشـــێکی تایبەتی لە لەش، بـە زۆری ئەوەی سنووری تایبەتی بۆ دانـدراوە |
| R's, Abdominal | مناطق البطن | ناوچەکانی زگ |
| R., Anal = lschiorectal | منطقـــة الـــشرج، المنطقـــة الشرجية | ناوچەی کۆم |
| R., Axillary | منطقـــة الأبـــط، المنطقـــة الأبطية | ناوچـەی بـن باخـەڵ: بـن باخەڵ و سنوورەکانی |
| R., Cubital | منطقة المرفق | ناوچەی ئانیشك |
| R., Epigastric | المنطقة الشرسوفية، منطقة الشرسوف | ناوچەی سەر دڵ |
| R., Hypochondriac | المنطقـــة المراقيـــة، منطقـــة المراق | ناوچەی خوار پەراسوو |
| R., Hypogastric | المنطقة الخثلية | ناوچەی بەر موسڵدان |
| R., Iliac | منطقة الحرقفة | ناوچەی کلۆت |

| | | |
|---|---|---|
| R., Infra-axillary | منطقة تحت الأبط | ناوچەی بن باخەڵ |
| R., Infraclavicular | منطقة تحت الترقوة | ناوچەی ژێر چەڵەمە |
| R., Inframammary | منطقة تحت الثدي | ناوچەی ژێر مەمك |
| R., Infrascapular | منطقة تحت اللوح | ناوچەی ژێر دەفە |
| R., Inguinal | المنطقة الأربية | ناوچەی ئەشكنج |
| R., Interscapular | منطقة بين اللوحين | ناوچەی ناوشان |
| R., Lumbar | منطقة القطن، المنطقة الطقنية | ناوچەی سێبەندە |
| R., Precordial | منطقة امام الثلب | ناوچەی بەر دڵ |
| R., Supraclavicular | منطقة فوق الترقوة | ناوچەی سەر چەڵەمە |
| R., Umbilical | منطقة السرة | ناوچەی ناووك |
| Regional | منطقي | ناوچەیی |
| R., Ileitis | التهاب اللفائفي المنطقية | هەوكردنی ڕیخۆڵە باریكەی ناوچەیی |
| Registrar | مسجل | ڕێجسترار، تۆمار كەرە |
| Registration | تسجيل | تۆماركردن |
| Registry | مركز التسجيل | بنكەی تۆماركردن:<br>١- فەرمانگەیەكە كە نەخۆشەوان (Nurse)ێك بۆی هەیە ناوی خۆی تێدا تۆمار بكات كە ئامادەیە بۆ ئیشكردن<br>٢- ئاژانس (فرمانگە)یەكی بۆ كۆكردنەوەی مادده و نموونەی نەخۆشی (pathological) و تیشكەوێنە.. هتد و ڕێكخستنیان بەشێوەیەك دەست بدات بۆ سوود لێ وەرگرتن بۆ خوێندن |

| | | |
|---|---|---|
| Reglementation | مكافحة البغاء | قەلاچۆكردنی بەدڕەوشتی |
| Regression | تقهقر | كشانەوە، دانەدواوە، نشوستی:<br>١- گەڕانەوە سەربارێكی پێشووتر<br>٢- نیشتنەوەی نیشانەی نەخۆشییەك یان نەخۆشیەكە خۆی<br>٣- (لە بایۆلۆجیدا) دانە دواوە (نشوستی) هەندێ بەرەباب (generation)ی یەك لە دوای یەكتر |
| Regressive | متقهقر | كشاوە، دواكەوتو، نشوستی هێناو |
| Regular | منتظم | ڕێك و پێك |
| Regulation | نظام، تنظيم | ڕێكخستن |
| Regurgitation | قلس، جريان عكسي | یەقدانەوە، یەفكردنەوە، هەڵهێنانەوەی خواردن، بەرەو دوا گەڕانەوەی خوێن بۆ ناو دڵ |
| R., Aortic | قلس الأبهر | پاشەكشەی شاخوێنبەر: گەڕانە دواوەی خوێن لە شاسوورە دەمارەوە بۆ ناو زگۆڵەی چەپ لەبەر ناتەواوی زمانە (دەرچە) داسی شاسوورە دەمار |

| | | |
|---|---|---|
| R., Mitral | قلس الثنائي | پاشەكشەی زمانەی دووتوێ: گەڕانەوە دواوەی خوێن لە زگۆڵەی چەپەوە بۆ گوێچكەلەی چەپی دڵ لەبەر باش كارنەكردنی دەرچە (زمانە) میترانی (دو پەڕەیی) |
| R., Pulmonic | قلس رئوي | پاشەكشەی سییە خوێنبەری: گەڕانەوە دواوەی خوێن لە خوێنبەری سییەوە بۆ ناو زگۆڵەی ڕاست لەبەر ناتەواو كاركردنی دەرچە (زمانە) داسیی، سی |
| Rehabilitation | تأهيل: اعادة مريض أو مصاب الى حالة من الأكتفاء الذاتي أو التوظيف المثمر على أعلى درجات المهارة الممكنة وبأقرب فرصة ممكنة | شایستە كاری: گێڕانەوەی نەخۆشێك یان زیان لێ كەوتوویەك بۆ سەرباری كار لە دەست هاتوویی یان بۆ سەر كار لە باشترین جۆرێكدا كە بشێت و بە زووترین كات |
| Rehalation | التنفس ثانيا | هەناسە دانەوە |
| Reichmann's Disease | مرض (ركمان): افراز العصارة المعدية المستمر | نەخۆشی (ریكمان) یەكبینە دەردانی شیلەی ئاشك |

| | | |
|---|---|---|
| R’s Sign | علاقة (ركمان) | نیشانەی (ریکمان): هەبوونی پاشماوەی خواردەمەنی ترش لەناو ئاشکدا سەر لەبەیانی پێش خواردن کە نیشانەی دەردانی شیلەی ئاشکی یەکبینە و تەنگبوونەوەی ئاشکەوان دەردەخات |
| Reimplantation | اعادة الفرز | داچەقاندنەوە: داچەقاندنەوە لە شوێنی خۆیدا هی بەشێك کە هەڵ کەندرابێت، وەك داچەقاندنەوەی ددانێکی هەڵکەندراو |
| Reinfection | تجدد (كر) العدوي | دووچاری نەخۆشی بوونەوە بۆ جاری دووەم بەهۆی هەمان هۆ یان یەکێکی تری یەکسان |
| Reinforcement | تقوية | بەهێز کردن، هێز پێدان |
| R. of Reflex | تقوية المنعكس | پەرچەکردار بەهێزکردن: پتربوونی پەرچە وەڵام (reflex response) بە خەریك کردنی نەخۆشەکە بە هەندێ کاری تری تەنەکی یان هۆشەکی لەو کاتەدا کە پەرچەکردارەکە دنە دەدرێت |

| | | |
|---|---|---|
| Reinnervation | تطعـــيم العـــصب، اعـــادة تعـــصيب: عمليـــة تطعـــيم عصب حي لأستعادة وظيفـة عضلة مشلولة | ڕەگ موتربە کردنـەوە: بـە برینکـاری موتوربــەکردنی ڕەگێکـــی زینـــدو بـــۆ گێڕانـــەوەی (خـــستنەوە گــــەڕی) ماســــولکەیەکی شـــەپلە لێـدراو بــۆ ســـەر فرمان |
| Reintubation | اعادة تنبيب | لولە تێخستنەوە: بۆ جاری دووەم تێخستنی لوولە |
| Reinversion | اعــادة القلــب: قلــب عــضو منقلب واعادته الى وضعيته السوية | هەلگێڕانەوە: هەلگێڕانەوەی ئەنــدامێکی هەلگــەڕاوە بــۆ سەر باری خۆی |
| Reisman’s Myocardosis | قلاب (ريسمان) العضلي | ماســـولکە هـــەلگێڕەووی (ریسمان) |
| Reisseisen's Muscles | عـضلات (ريـسيس): الأليـاف العضلية للقصبات | ماســولکەکانی (ریـــسیس): ماســولکە ڕیــشالّ (رشــالّە ماســـولکە)کـــانی بـــۆریی هەناسە |
| Reiters Disease | مرض (ريتر) | نەخۆشــــــیی (ڕیتــــــەر): نەخۆشــییەکە نێرینــە دەی گرێــت، ســـەرەتای بـــە زگ چوونە، لەوە دوا هـەوکردنی میـــزەڕۆ و چـــاو داهـــاتن و هـەوکردنی فـرە جومگـەیی لەگەلّ پێست ئەستوور بوون هەندێ جار |

| | | |
|---|---|---|
| R’s Syndrome | لزمة (ريتر) | سیندرۆمی (ڕیتەر): تووشبوونی هەوکردنی میزەڕۆ و چاو یەشە پێکەوە لەگەڵ هەوکردنی جومگە ئەم نەخۆشییانە هەموو چ پەیوەندییەکیان بە سووزەنەکەوە نییە |
| Rejuvenescence | تجدد الشباب، إصباء | گەنجبوونەوە، هەرزەكار بوونەوە: نوێ بوونەوەی هەرزەكاری یان هێز و چالاكی |
| Relapse | رجعة | پەیدابوونەوە، گەڕانەوە: دەركەوتنەوە یان گەڕانەوەی نەخۆشییەك دوای بە ڕواڵەت نەمانی |
| R., Intercurrent | مابين مجريين | نێوان دوو ڕەوت، گەڕانەوەی نەخۆشی پێش ئەوەی تاكەی گەڕابێتەوە (هاتبێتەوە) یان بگەڕێتەوە سەر پلەی ئاسایی |
| R., Rebound | ارتداد | گەڕانەوە، گەڕانەوەی هەندێ لە نیشانەكانی نەخۆشییەك لەگەڵ دەست هەلگرتن، لە دەرمان پێدانی |

| | | |
|---|---|---|
| Relaxant | مرخي | خاوکەرەوە:<br>١- هـــۆی کەمکردنـــەوەی کرژی (توندی)<br>٢- دەرمانی خاو کردنـەوەی کرژی (توندی) |
| Relaxation | ارخاء<br>١- تخفيف شدة التوتر<br>٢- الأراحة من شدة الألم<br>٣- ارخــــاء العــــضلة دون تقصيرها | درژە بوون، خاوکردنەوە<br>١- کەمکردنـــەوەی تونـــدی (tension)<br>٢- ئـــــازار کەمکـــــەرەوە (سووك کەر)<br>٣- خـاو کـەرەوەی ماسـولکە بێ کورت بوونەوەی |
| R., Isometric | ارخــاء ايــسومتري: ارخــاء العضلة دون تقصير في طولها | خـاو کردنـەوەی هاودرێـژی: خـــــــاو کردنـــــــەوەی ئایسۆمەتری: خاوکردنـەوەی ماسـولکە بـێ ئـەوەی کـورت بێتـەوە (واتـا لەسـەر هـەمان درێژی خۆی بمێنێت) |
| Relief | تفريج | ســـووك کـــردن (بـــوون) کەمکردنـەوە یـان لابردنـی (نەهێشتنی) ژان |
| R., Incision | تفرع قطع، تفرع شق | کەمکردنەوەی بڕین |
| Relieve | يفرج (عن الألم، الكرب) | ژان ســـووك کـــردن، بـــە هاناوە چوون |
| Reluxation | الخلع ثانية | لە جێچوونەوە |

| | | |
|---|---|---|
| Remak's Band | شريط (راماك): اسطوانة | شــريتى (ڕامــاك): لوولــه تەوەرەییەك |
| R.'s Fibers | الياف (راماك) | ڕیشاڵەكانی (ڕاماك) |
| R.'s Ganglion | عقدة (راماك) | گرێـی (ڕامـاك): گرێیـەكی سیمپەساوییە لەناو شانەی دڵــدا نزیــك خــوێنهێنی كلۆری سەروو |
| R.'s Plexus | ضفيرة (راماك) | پرچی هۆنراوەی (ڕامـاك)، پـرچـــــی هـــــۆنراوەی (میسنەر)ە |
| R.'s Sign | علاقة (راماك) | نیشانەی (ڕاماك) |
| Remedial | علاجي، دوائي | چـارەكەر، دەرمــان، كـاری دەرمان كەر |
| Remedy | علاج، دواء | دەرمـان، چـار، چـارە: هـەچ شـتێك كـە نەخۆشـی چـاك دەكاتــەوە، ســووك دەكـات، یان نای هێڵێت |
| Remission | خمود | كپبـوون: كەمبوونــەوە یـان نیــشتنەوە (ســووكبوون)ی نیـشانەكانی نەخۆشـییەك، هـــەروەها ئـــەو مـــاوە (دەم)ەیـــە كـــە ئـــەم كەمبوونەوە و سوكبوونەی تێدا دەبێت |
| Remittent | مترددد | دەمـــدەمی: مــاوە (دەم)ی سووك بوون و توند بوونی هەیە |

| | | |
|---|---|---|
| R., Fever | | تـــای دەمـــدەمی: تایەکـــە نیـشانەکانی کـەمتر دەبنـەوە بە جۆرێکی ئاشکرا لە دەمـی تایبەتیـــدا بـــەبێ ئـــەوەی بەتەواوی لە ناوبچن |
| Remittene | هدنة | دەمـــــە ســــــووکبوون: سـووکبوونێکی دەمـی (بـە بێ وەستانی ڕاسـتەقینە)ی نیشانەکان (ی نەخۆشی) |
| Remnant | بقية، فضلة | بـــەرماوە، مـــاوە، لێمـــاوە، فەزڵە |
| Ren | كلية، كلوة | گورچیلە، گورچك |
| R. mobiles | كلية متحركة | گورچـــــیلەی بزێـــــو، گورچیلەی لەق |
| R. unguiliformis = Horseshoe kidney | كلية حدوة الحصان | گورچــیلە نــاڵی: دۆخێکـە هـــەردوو گورچـــیلەکان لەســـەرێکیانەوە پێکـــەوە دەلکێن |
| Renal | كلوي | گورچـــیلەیی، پەیوەنـــدی گورچیلە |
| Rendu's Tremor | رعشة (رندو) | لەرزەی (ڕەندو): لەرزەیـەکی هیـــــــستەریاییە بـــــە بزووتنـەوەی خۆویـست دنـە دەدرێـت یـان پـتر دەبێـت، لەرزەی ئەنقەستی گەشکە |

| | | |
|---|---|---|
| Rendu-Osler-weber's Disease | مــرض (رنـــدو - اوســـلر - ويــبر): داء الأورام الوعائيــة الــوراثي العــائلي المــصطحب بالنزف | نەخۆشی (ڕەندو - ئوسلر - ڤێبـــــەر) نەخۆشـــــی پەنامـەکانی خوێندانەکانـە کە بە جـۆرێکی خێزانـی و میراتـــی پەیـــدادەبێت و خوێن بەربوونیشی لەگەڵە |
| Renicapsule | غــدة كظريــة، غــدة فــوق الكلية | گلانـــدی ســـەر گورچـــیلە، ئەدرینالە لوو |
| Renicardiac | كلوي قلبي | گورچیلە و دڵی: پەیوەندی گورچیلە و دڵ |
| Reniculus | فصيص كلوي | قاشـــە گورچـــیلە، پلـــە گورچیلە: یەکێك لەو قاش (پـل)انـەی گورچـیلە پێـك دەهێـــنن و بریتییـــە لـــە پۆپتیــژ و مـاددەی توێکـڵ بەدەوریدا |
| Renifleur | مستنـــشق: الـــذي يـــستثار جنـــسيا بـــالروائح وخاصـــة رائحة بول غيره | بۆنهـەژیو: ئـەوەی بـە بـۆن ئـــــارەزووی زایەنـــــدی هەڵدەســتێت بــە تایبــەتی بۆنی میزی کەسانی تر |
| Reniform | كلوي الشكل | گورچـــیلەی، گورچـــیلەی شێوە |
| Renitent | مقاوم | بەرگە گر |
| Rennet | رنيت | ڕەنێـــت: ماددەیەکـــە لـــە ئاشـك (گـەدە)ی گوێرەکـە دەردەهێنـــــدرێت کـــــە (ڕەنـــین)ی تێدایـــە وەك هـەوێن بـۆ پـەنیر دروسـت کردن بەکاردێت |

| | | |
|---|---|---|
| Rennin | (رنين) | (ڕەنــــــین) هـــــەوێنی شیرمەیاندنە بۆ کردنی بـە پەنیر لە چوارەمین گـەدەی (هـەزار لۆغانـە) گوێرەکـە دەست دەکەوێت، فریشك |
| Renography | تصوير الكلية (شعاعيا) | تیــــشکە وێنــــەگرتنی گورچـیلە: بـەهۆی تیـشکە وێنـەگرتنی گورچـیلە لــە باری گورچیلە تێگەیشتن |
| Renopathy | اعتلال الكلية | دەردی گورچــــیلە: هــــەچ نەخۆشێکی گورچیلە بێت |
| Repand | متموج | چرچ، پێلدار |
| Repellent | طارد | دەرکەرە، ڕەوێن، تەرەکەر:<br>١- توانـــای دەرکـــردن یـــان تەرە کردنی هەیە<br>٢- دەتوانێـــــت پــــــەنام (ئاوســـــــاوی)یـــــــەك بڕەوێنێتـــــــــــــــەوە (بڵاوبکاتەوە) |
| Repeller | طارد | ڕەوێــن، دەرکـەر: ئامێرێکـە بەکاردەهێنـــدرێت لـــەکاتی زاییـنـــی چـــوارپێدا بـــۆ بردنــەوە دواوەی ئاولەمەکـە (پزەکـــە) تـــاوەکو ســـەر و پێچکەکانی بەشێوەی ئاسایی دەچنە سەربار بۆ زایین |

| | | |
|---|---|---|
| Repercussion | إرتداد | گەڕانەوە |
| Repetatur | لتجدد | با تازە بكرێتەوە، با سەر لە نوێ بكرێتەوە |
| Repletion | امتلاء | پڕی، تێری: دۆخی پڕی |
| Replication | تكرار | دوو پاتكردنەوە، پتكردنەوە:<br>١- قەد كردنی بەشێك بە جۆرێك لە دوو قەدی بكرێت<br>٢- دوبارە كردنەوەی تاقی كردنەوەیەك بۆ سوور بوون لە ڕاستی و تەواوی |
| Reposition | اعادة وضع | خستنەوە جێ، لەجێی خۆی دانانەوە |
| Repositor | معيد الوضع | شوێنخۆخەرەوە: ئامرازێكە بۆ پێ خستنەوە شوێنی خۆی ئەندامی لەجێی نەماو (لاچو) |
| Repression | الكبت | چەپاندن: لە ئاگاوە فرێدانەوە دواوە بۆ نائاگا ئەو بیرەك و هەستانەی كە سروشتێكی نا لەبار ناقۆلایان هەیە |
| Reproduction | تناسل، تكاثر، انتاج تجدد | زاوزێ، زۆر بوون، دروست كردن، تازە كردنەوە (نوێبوونەوە) |

| | | |
|---|---|---|
| R., Asexual | **تناسل لاجنسي** | **زاوزێـــــی نارەگـــــەزی: زۆربوون بە بێ یـەکگرتنی خانە جنسییەکان** |
| R., Sexual | **تناسل جنسي** | **زاوزێـی جنـسی: زۆربـوون بـە یـەکگرتنی خانەیـەکی مێ و خانەیـەکی نێـر، یـان بـــە گەشـــە کردنـــی هێلکەیەکی نەپیتێنراو** |
| Reproductive | **تناسلي** | **پەیوەنـدی زاوزێ، یـان بـۆ مەبەستی زاوزێ دەشێت** |
| Repulsion | **تنافر، دفع** | **لێك دووركەوتنەوە، پـاڵ پێوە نان: کرداری لێك جیاکردنەوە یان دورخستنەوە، هێزێك کـە دەیــەوێت دوتــەن لێــك دوور بخاتەوە، پێچەوانەی ڕاکێشانە** |
| Resect | **يقطع** | **دەبڕێت** |
| Resection | **قطع** | **بڕین: بڕینی بەشێکی باش لـە ئەنــدامێك بەتایبــەتی بڕینــی ســەرەکانی ئێــسك یان پێکهاتووەکانی تری کە جومگەیان لێ دروست بووە** |
| R., Submucous, Window R. | **قطع تحت الغشاء المحاطي** | **بڕینــی ژێــر چــڵمە پــەردە: بڕینــی بەشــێك لەئێــسقانی پــەردەی لــووتی خــوار دوای هەڵدانــەوەی هەنــدێك لـــە پـەردە چڵمنەکەی سـەری کـە لــەدوای بڕینــی ئێــسقانەکە دادەدرێتەوە جێی خۆی** |

| | | |
|---|---|---|
| R., Transurethral | القطع عبر المبال | بڕین له ناو میزەڕۆوە |
| Resectoscope | جهاز لقطع البروستات عبر المبال | دەزگایەکە بۆ بڕینی پرۆستات لەناو میزەڕۆوە |
| Reserpine | (رسربين) | (ریسەر پین): ئەلّکەلۆیدێکی بەکارە له ڕەگی هەندێ جۆر درەختی (راولفیا) پەیدادەکرێت و دژی پەستانی خوێن بەکاردەهێندرێت، هەروەها بۆ چارەکردنی خەمۆکی و هەندێ نەخۆشی دەروونی تر باشە |
| Reserve | احتياط | یەدەگ: شتێکی عەمار کراو بۆ بەکارهێنان لە پاشە ڕۆژدا |
| R., Alkali, Alkaline R | الأحتياط القلوي | یەدەگی ئەلكالی، تفتە یەدەك، ئەلكالی یەدەگ: بڕی ئەو ئامێتە (پێکهاتوو)ە (Buffer)انەی ناو خوێن کە له باریاندایە ترش هاوکێش بکەن (neutralize) وەك بیکاربۆناتی سۆدیۆم، دوانە فۆسفاتی پۆتاسیۆم لەگەڵ پرۆتینەکان و لەبەر ئەوەی کاربۆناتی سۆدیۆم گرنگترینیانە لەبەر ئەوە زاراوەی (بیکاربۆناتی خوێن) زۆر جار بەکارهێنانی لە (یەدەگی ئەلكالی) بە باشتر دەزانرێت |

| | | |
|---|---|---|
| R., Cardiac | احتياط القلب، الأحتياط القلبي | یەدەگی دڵ، دڵە یەدەگ: هێزی یەدەگ یان توانستی پەمپ کردن لەدڵدا کە دەشێت هانای بۆ ببرێت لەکاتی پێویستیدا بۆ بەکارهێنان |
| Reservoir | مستودع | عەمار، عەماراو: شوێن یان جێگایەك بۆ شت تێدا عەمار کردن |
| Resident | مقيم | نیشتەجێ: پزیشکێکە کە لە زانستگا دەرچووە و دیپلۆمای وەرگرتووە و لە خەستەخانەیەکدا نیشتەجێیە |
| Residual | فضالة، متبقي، ثفالي | ماوە، بەرماوە، تڵپە |
| Residue | فضالة، بقية، ثقالة | ماوە، تڵپە: ئەوەی دەمێنێتەوە دوای لابردنی شتەکانی تر |
| Residuum | فضالة، بقية، ثفالة | ماوە، بەرماوە، تڵپە |
| Resillience | مرونة، مطاطية | جیڕی، پێز، لاستیکێتی: تایبەتی چوونەوە سەر شێوە یان قەبارەی خۆ دوای راکێشان.. هتد |
| Resin = resina | راتنج | جەوی: ماددەیەکی ئەندامیی ڕەق یان نیمچە ڕەقی ناکریستاڵ (Amorphous)ە لە سەرچاوەیەکی ڕووناکی یان دەستکردە، جەوییە ڕاستەقینەکان لە ئاودا ناتوێنەوە بەڵام بە ئاسانی لە کهوول و ئیسەر و ڕۆنە فڕۆکەکاندا(فڕیوەکاندا) دەتوێتەوە |

| | | |
|---|---|---|
| R’s, Acrylic | **راتنج اكريلي** | **جـــــەوی ئـــــەکریلی: پەپولیمـــــەرێنی ترشـــی ئـــەکربلیك یـــان میتـــا ئەکریلیك دروست دەکرێت بـــۆ زۆر مەبەســـت لـــە پزیـشکیدا بـەکاردێت وەك بۆ ئەندامی بریتی دروست کردن.. هتد** |
| R., Direct filling | **راتنج التحشية المباشرة** | **جـــــەویی ڕاســـــتەوخۆ پڕکردنەوە لە ددانسازیدا** |
| R., Gum | | **بنێـشتە جـەوی، جـەوی بنێشت** |
| R., Ion exchange | **راتنج تبادل أيوني** | **جەویی ئایۆن گۆڕکێ** |
| R., Styrene | **راتنج الستايرين** | **ستایرینە جەوی** |
| R., Synthetic | **راتنج اصطناعي (تركيبي)** | **جـــــەوی دەســـــتکرد (دروستکراو)** |
| R., Vinyl | **راتنج فنيلي** | **جـــەوی ڤینیلـــی: ڕەگـــی ڤاینیل** (-CH2:CH)**ی تێدایە** |
| Resistance | **مقاومة** | **بەرگـــــەگری، بـــــەرگری، بەرهەڵستی:**<br>**١- توانـــــای سروشـــــتی (خۆڕســـك)ی کەســـێك بـــۆ بەرگـە گرتنـی کـاری دژواری ئـــەو هـــۆ زیاندەرانـــەی وەك ژەهـــر، تۆکـــسین، میکرۆبـــی نەخۆشی..هتد**<br>**٢- بەرهەڵستی گـەیێنێك بـۆ ڕۆیشتنی تەزووی کارەبا**<br>**٣- (لەشـــــی کردنـــــەوەی دەروونیـــدا) بـــەرگری یـــان بەرهەڵستی کردنـی هاتنـەوە ئاگای ماددەی چەپاندراو** |

| | | |
|---|---|---|
| R., Acid Alcohol | مقاومة كحول الحامض | بەرگری کهولی ترش |
| R., Essential, Internal R | مقاومة أساسية، مقاومة داخلية | بەرگری بنچینەیی، بەرگری ناوەکی، بەرگری ناوەوە: بەرگری بۆ تەزووی گالڤانی کە لە ناو خانەکانی خۆیاندایە |
| R., Coil | ملف المقاومة | کۆیلی بەرگری: کۆیلێکی تەل (وایەر)ە کە بەرگری کارەبایی زانراوە و بۆ دۆزینەوەی بەرگری بەکاردەهێندرێت |
| R., External | المقاومة الخارجية | بەرگری دەرەکی (دەرەوە): ئەوەیە کە لە سووڕی تەزووی کارەباکەی دەرەوەی خانە (پیل)ەکە دایە |
| R., Peripheral | المقاومة المحيطية | پەراوێزە بەرگری، بەرگری پەراوێزی: بەرگەگری بۆ ڕۆیشتن (سووڕانەوە)ی خوێن بە ناو خوێندانە بچووکەکاندا |
| R., Vital | المقاومة الحيوية | زیندە بەرگری، بەرگەگری ژیانی: ئەو بەرگرییەی کەسێك هەیەتی بەرامبەر تووشی نەخۆشی بوون، ماندوێتی..هتد |

| | | |
|---|---|---|
| Resolution | إنحلال، تحلل، إمتصاص، إنصراف | ڕەوینەوە: دامرکانەوە و نیشتنەوەی هەوکردنێك، نەرم بوون و بڵاوبوونەوەی ئاوسانێك (ئاوساوییەك) |
| R., Abcess | انصراف الخراج | ڕەوێنەوەی دوومەڵ، دومەڵ ڕەوێنەوە: نەرم بوون و بڵاوبوونەوەی دومەلێك |
| Resolve | اعادة ذوبان | دووبارە تواندنەوە |
| Resonance | رنين | لەرینەوە |
| R., Vocal | رنين صوتي | دەنگە لەرینەوە |
| R., Whispering | رنين همسي | سرپە لەرینەوە |
| Resonant | رنان | لەراوە، زرنگاوە |
| Resorption | ارتشاف | هەڵمژینەوە |
| Respiration | تنفس | هەناسە، هەناسەدان:<br>١- کار و فرمانی هەناسەدان، ئەو کردارەی بەهۆیەوە هەوا هەڵدەمژرێت بۆ ناوەوە دەکرێتەوە دەرەوەی سییەکان (هەناسە وەرگرتن و هەناسە دانەوە) |
| R., Abdominal | تنفس بطني | زگە هەناسە: ئەو جۆرەیە کە بەهۆی ماسولکەکانی زگ و ناوپەنچکەوە بەردەوام ڕادەگیرێت |

| | | |
|---|---|---|
| R., Accelerated | تنفس متسرع | هەناسەی خێرا: ئەوەیە کە ژمارەی لە دەقیقەیەکدا لـە (٢٥) جار تێپەڕ بکات |
| R., Aerodic | تنفس هوائي | باهەناسـەـ، هەناسـەی هەوایی، هەوا هەناسە |
| R., Amphoric | تنفس خزفي | هەناسـەی گلێنـەیی: هەناسـەی دانێکـی (Blowing)ە کـە لـە بۆشایی (کەلێن)ی گەورەی دیـوار ئەسـتووردا پەیـدا دەبێـت، ئـەو سـیفەتە تایبەتییـەی هـی دەنگدانەوە (زایەڵە)یـە لـە دیواری کەلێنەکەوە |
| R., Anaerobic | تنفس لاهوائي | بێبـا هەناسـە، هەناسـەی ناهەوایی، ناهـەوا هەناسـە: جۆرە هەناسـەدانێکە وزەی تێـدا بـەرەڵلا دەبێـت (دەسـت دەکـەوێت یـان پەیـدا دەبێـت) بـەهۆی کـارلێککردنی کیمیاییـەوە کـە چ فرمـان (دەور)ێکـی ئۆکسجینی تێدا نییە |
| R., Artificial | تنفس صناعي | دەسـتکردە هەناسـە، هەناسـە پێـدان: کردنـی بزوتنـەوە ئاسـاییەکانی هەناسـەدان بەشـێوەی دەسـتکرد وە هـەر بـەو جۆرەش بەردەوام ڕاگرتنی |
| R., Bronchial = tubular b | تنفس قصبي | قامیشە هەناسە، هەناسـەی لولە یان بۆری |

| | | |
|---|---|---|
| R., Bromochocavernous | تنفس قصبي كهفي | قــــاميش و ئەشـــــكەوتە هەناســـە، هەناســـەی لۆلــە (بۆری) و ئەشکەوتی |
| R., Cavernous | تنفسي كهفي | ئەشــــــكەوتە هەناســـــــە، هەناسە (دان)ی ئەشکەوتی |
| R., Cheyne-stokes | تنفسي (چاين – ستوكس) | هەناســە(دان)ی (چــاین و ســــــــتۆکی): جـــــــۆرە هەناســــــەدانێکە لــــــە ڕەقبــوونی ســوورەخوێنبەر (artereosclerosis)، پیری، نەخۆشـــــی دڵ.. هتــــــد بریتییـــــە لــــە دەمــــی هەناســـەدانێك کـــە وردە وردە خێـرا تـر و تونـد تـر دەبێـت تـا دەوەسـتێت بـۆ ماوەیـەك ئینجا وردە وردە دەســـت پــێ دەکاتـــەوە و خێراتر و توند تـر دەبێت تا دەوەستێتەوە.. هتد |
| R., Cog-wheel | تنفس متقطع | پــچڕە هەناســە، هەناســەی پچڕ پچڕ: هەناسـە دانێکـە دەنگی هەناسە وەرگـرتن و دانــەوەی تێـدا پـچڕ پـچڕە وەك دو دەنـــگ یـــان پـــتر دێنە بەر گوێ |
| R., Cutaneous | تنفس جلدي | پێـــستە هەناســـە، هەناســـە (دانـــی) پێـــستی، پێـــستە هەناســــە (دان) دەردانــــە دەرەوەی هــەڵم و هەڵمـژینی ئۆکسجین لە پێستەوە |

| | | |
|---|---|---|
| R., Diaphragmatic | تنفس حجابي | ناوپەنچكە هەناسە، ناوپەنچك (تەڕاف)ە هەناسە (دان)، هەناسەی ناوپەنچكی (تەڕافی): ئەو هەناسەدانەیە كە بە زۆری بەهۆی ناوپەنچك (تەڕاف)ەوە پێك دەهێندرێت |
| R., External | تنفس خارجي | دەرە هەناسە، هەناسە (دان)ی دەرەكی (دەرەوەیی): ئاڵوگۆڕكردنی پێكهێنە گازییەكان لە ناو سییەكاندا |
| R., Fetal | تنفس حميلي | هەناسە (دانی) ئاولەمە: ئاڵوگۆڕكردنی گاز بە ناو بەستی ئاوەڵە (پلاسەنتا)دا |
| R., Forced | تنفس قسري | زۆرە هەناسە، هەناسە (دان)ی توند: ئەوەی كە پتر لە پێویست هەوای تێدا وەردەگیرێت |
| R., Harsh = bromehovesieular r | تنفس خشن | هەراشە هەناسە، هەناسە (دان)ی هەراشی |
| R., Interrupted = Cog-wheel | تنفس متقطع | پچڕە هەناسە، هەناسە (دان)ی پچڕ پچڕ |
| R., Laboured | تنفس متراخي | خاوە هەناسە |

| | | |
|---|---|---|
| R., Stertorous | تنفس شخيري | پرخـه هەناسـه، (هەناسـه (دان)ى بـــه پرخــــه، پرخانـــدن: ئەوەيـــه كــه دەنگـــى نائاســـايى وەك پرخه پرخى له گەڵدايه |
| R., Suppressed | تنفس مكبوت | كپــه هەناســه، هەناســه (دان)ى بێــدەنگ: ئەوەيــه كه دەنگێكى ئـەوتۆى نييـه وەك ئـەوەى لـه ڕەقبـوونى بــەرينى ســيدا يــان لــه ناوچوونه سنگدا دەبێت |
| R., Thoracic | تنفس صدري | هەناســه (دان)ى ســـنگى، بەسنگ هەناسـەدان، سـنگه هەناســه (دان): ئـــەوەى بــەهۆى ماســولكەى نێــوان پەراســوو و ماســولكەكانى ترى سنگەوه پێك دێت |
| R., Vesicular | تنفس حويصلي | سيكڵدانۆچكه هەناسه |
| Respirator | جهاز للتنفس | دەزگــاى هەناســه پێــدان، هەناسه پێـدەر: دەزگايەكـه بۆ گۆڕينى چۆنەتى هەواى هەناسـه يـان بـۆ هەناسـه پێدان |
| R., Cabinet | كابينة التنفس | كابينەى هەناسەدان |
| R., Cuirasse | درع التنفس | قەڵغانى هەناسەدان |

| | | |
|---|---|---|
| R., Drinker = Iron Lung | جهاز (درنکەر) للتنفس، الرئة الحديدية | ئاسنە سی، دەزگای هەناسە پێدانی (درینکەر)، سییە ئاسنینە، سی ئاسنین: دەزگایەکە بۆ هەناسە پێدان بۆ ماوەیەکی درێژ، بریتییە کە بەرمیلێکی کانزا بە دەوری لەشی نەخۆشەکەدا کە هەر سەری لە دەرەوە دەبێت لەناویدا هەناسەدان بەجۆرێکی دەستکرد بەردەوام دەبێت زۆرتر پەستاوتن و کەمتر پەستاوتنی بەرودوا نێگەتیف کردنی بەدوای یەکدا |
| Respiratory | تنفسي | هەناسەی، پەیوەندیدار بە هەناسەوە |
| R., Quotient | الحاصل التنفسي | بەرەنجامە هەناسە (دان): ئەنجامی دابەش کردنی بڕی دوانۆکسیدی کاربۆنی بە هەناسە دراوەوە بەسەر بڕی ئۆکسجین کە بە هەناسە وەرگیراوە |
| Respirometer | مقياس التنفس، سبايرومتر | هەناسە پێو(ەر)، سپایرۆمیتەر: ئامرازێکە بۆ دیاری کردنی چۆنێتی (سروشت)ی هەناسەدان |
| Respire | تنفس | هەناسەدان |

| | | |
|---|---|---|
| Response | استجابة | وەڵام، وەڵامدانـەوە: کـردار یان جووڵەیە کە لە وەڵامی بـەکارهێنانی دنەدەرێکـدا دەکرێت |
| R., Inverse | استجابة عكسية | دژە وەڵام، وەڵامـــــــــی پێچەوانە: دروست کردنـی هورمـــۆنی قەدەغەکـــەر (uihibitory) لـــە لايـــەن زینـــدەوەرەوە لـە وەڵامـی زۆر پێدانی هۆرمۆندا |
| R., Reticulocyte | استجابة الخلايا الشبكية | وەڵامـــــی تۆڕەخانــــــە، زۆربـوونی دروسـت کردنـی تۆڕەخانـــە دوا بـــە دوای پێدانی دەرمان |
| Rest | راحة، بقية | پشو، ماوە،<br>١- پشو دان دوای ماندوێتی<br>٢- هەنـــدێك لــە شــانەی ئاولەمـــــە (تەیمانــــــە ئاولەمـەیی) کـە هێـشتا لـە زیندەوەرەکەدا ماوەتەوە |
| R., Adrenal | راحة الأدرينال | پشووی ئەدرینالٚ |
| R., Bed | متكأ | پاڵپـــشت: ئامرازێکــە بــۆ ڕاسـت ڕاگرتنـی نەخۆشـی (بـــە قنگـــەوە ڕاگرتنـــی) لەناو جێگادا |
| Restbite | عضة الأستراحة | گـازی پـــشو: جووتبـوونی ددانـــەکان لەســـەر یـــەك لەکاتی پشووی کاکیلەدا |

| | | |
|---|---|---|
| Restiform | حبلي (حبلي الشكل) | پەتکە تەن، پەتی، لە شێوەی پەت (گوریس)دا |
| R. body | الجسم الحبلي | تەنە پەتی |
| Restitutio=Restitution | استرجاع، إعادة | گێڕانەوە، دووبارەکردنەوە |
| R. integrum | العودة التامة الى الصحة، استرجاع كامل الصحة | بە تەواوی گەڕانەوە سەر تەندروستی، تەواو چاکبوونەوە |
| Restoration | استرجاع، استرداد | گەڕانەوە، وەرچەرخان:<br>١- گەڕانەوە سەرباری ئاسایی<br>٢- سووڕخواردن (وەرچەرخان)ی ئەو بەشەی ئاوڵەمە کە لە پێشەوە دێت لە زایینـدا (وەك سەر..هتد) ڕاستەوخۆ دوای لەدەمی کوڵینك هاتنە دەرەوە |
| R., Buccal | | : پڕکردنەوە (بوونەوە)ی ئەو شوێنانەی ددانی لێ هەڵکێشراوە لە ناو دەمدا بە شانەی نوێ |
| Restorative | مرجع، راد | گێڕەرەوە:<br>١- گەڕانەوە سەر تەندروستی یان هۆشی ئاسانتر دەکات،<br>٢- دەرمانێك کە یارمەتی گەڕاندنەوەی تەندروستی، خورتی یان بە ئاگایی دەدات |

| | | |
|---|---|---|
| Restraint | مجر | داگیرکردن: بەزۆر بێدەس کردن و داگیرکردنی کەسانێك کە دووچاری نەخۆشی دەروونین یان جۆشیان گرتووە |
| R.,Chemical | حجر كيمياوى، حجر دوائي | بە دەرمان داگیرکردن: بەدەرمان بێدەس کردنی ئارامی پێدان بەنەخۆشی دەروونی خرۆشاو.. هتد |
| Resultant | محصلة | بەرەنجام: هەر یەکێ لە بەرهەمەکانی کارلێك کردنێکی کیمیاوی |
| Resupination | الأنقلاب على الظهر، الأستلقاء على الظهر | وەرگەڕانە سەرپشت، لەسەر پشت پاڵکەوتن:<br>١- وەرگەڕان بۆ سەرپشت<br>٢- باری کەسێك لەسەرپشت پاڵکەوتبێت |
| Resurrection | بعث، نشور | زیندوو کردنەوە (لەدوای مردن) |
| Resurrectionist | سارق الجثث من القبور | لاشە دز: بەتایبەتی ئەوەی گۆڕ هەڵدەداتەوە بۆ دزینی لاشەکەی ناوی |
| Resuscitation | انعاش، إفاقة: اعادة الشخص الى الحياة أو الوعي بعد موت ظاهري | بووژاندنەوە: زیندو کردنەوە یان هێنانەوە سەرخۆی کەسێکی بەرواڵەت مردو |

| | | |
|---|---|---|
| R. of the Heart | انعاش القلب | دڵ بوژاندنەوە، بووژاندنەوەی دڵ: کـــرداری گێڕانـــەوەی لێـــدانی دڵ و هێنانـــەوە سـەرباری خـۆی تـەوژم پاڵـە پەستۆی خوێنەو بریتییە لە: ١- گێڕانـــەوەی نـــەریتی (system) ئۆکـــسجین بـــۆ پاراستنی ژیـوەری مێـشك (کـە کردارێکـــی زۆر تاڵوکەیـــە دەبێـــت لـــەماوەی ٣ – ٥ دەقیقەدا جێ بە جێ بکرێت ٢- گێڕانــەوەی دڵ بــۆ لێــدان بەرێکی |
| Resuscitator | المنعشة، المفوقة: آلة أو جهاز يـــستخدم للأنقـــاذ مـــن الأختناق | بوژێنـــەوە: ئـــامراز یـــان دەزگایەکە بۆ رزگـار کـردن لـــە خنکـــان بـــەکار دەهێندرێت |
| Retardation | تخلف، اعاقة | دواکـــەوتن، دواخـــستن، تەگەرە تێخستن |
| R., Mental | تخلف عقلي | دواکـــەوتنی هۆشـــەکی: نـــەبوونی گەشـــە کردنـــی (فـراژی بـوون)ی هۆشـەکی ئاسایی |
| R. of Thought | تخلف الفكر | دواکـــەوتنی بیرکردنـــەوە: دواکەوتن لە بیرکردنـەوەدا بــە جــۆری یــان کــرداری بیرکردنـەوە کـە لـە خۆیـدا خاو و سستە یان کە دەست کـرا بـە بـیر کردنـەوە بـە جۆرێکی سست دەڕوات |

| | | |
|---|---|---|
| Retching | تهوع | هێڵنج، هێڵنجدانەوە |
| Rete | شبكة، طفير | تۆڕ، هۆنراوە: تۆڕێك لە ڕەگ یان بەتایبەتی لە خوێندانەکان |
| R. mirabile conjugatum = or | الشبكة الوعائية | تۆڕە بۆریی خوێن |
| R. mirabile geminum | الشبكة الوعائية المزدوجة | تۆڕە خوێندانی جووت: تۆڕێکە پێکەوە ئالۆزانی خوێنبەر و خوێنهێن پێکەوە دروست بووە |
| R. testis | الشبكة الخصيوية | گونە تۆڕ: تۆڕێکە لە قەنالە ڕاستەکان (mediastimum)ی گون پێکهاتووە |
| Retention | إحتباس | گیران: ڕاگیرکردنی هەندێ شت لەناو لەشدا بۆ ماوەی درێژ کە بەئاسایی دەردەدرێنەوە بێ ڕاگیرکردن |
| R. of Urine | احتباس البول | میزگیران: ڕاگیر کردنی میزە کە هەر دروست دەبێت لە میزەڵاندا |
| Reticular | شبكي | تۆڕی، تۆڕەکی: پەیوەندی تۆڕە یان لەشێوەی تۆڕدا بوون |

| | | |
|---|---|---|
| R. Formation | التشكيل الشبكي | پێکهاتووی تۆڕی: تۆڕێکی ڕیشاڵییە لەناو مێشکە درێژکۆلەدا لە پشت ڕێبازە پۆپتیژەوە و تاکو پردی (poms) دەگات |
| R. Tissue | نسيج شبكي | تۆڕە شانە ، تۆڕە تەیمانە (تەنراو) |
| Reticulated | شبكي، مشبك | تۆڕەکی، تۆڕاندن |
| Reticulation | تشبك | تۆڕ کردن، تۆڕین: دروست بوون یان تێدا هەبوونی تۆڕێك |
| Reticulocyte | خلية شبكية | تۆڕەخانە، خانەی تۆڕی: خڕۆکەی سووری خوێنی وەك تۆڕ یان تۆڕدار لەکاتی خوێن نوێبوونەوەدا دەبینرێت |
| Reticuloendothelial | شبكي بطاني | تۆڕ و ناوپۆشی: پەیوەندی ئەو تەیمانە (تەنراوانە)ی کە لە هەردوو جۆرەکەیان تێدایە |
| Reticuloendothelioma | ورم شبكي بطاني | ئاوسانی شانە تۆڕی و ناو پۆشییەکان، ڕەتیك و لوئێند و شیلیۆما: پەنامی سیستەمی تۆڕ و ناو بەرگی (رتیکیو لوئێند و سیلیال) |

| | | |
|---|---|---|
| Reticuloendotheliosis | داء شبكي بطاني | دەردە تـۆڕو نـاوپۆش: زۆر بـوونی شـانەی تـۆڕە و نـاوپۆش بـە جـۆرێکی نەخۆشی |
| Reticuloendotheliom | البطانة الشبكية | تۆڕە نـاوپۆش: شـانەی تـۆڕ و ناو بەرگی، شانەی تـۆڕ و ناوپۆش |
| Reticuloma | ورم شبكي: ورم متكون من خلايا من اصل شبكي بطاني | تۆڕە پەنام:: ڕەتيك و لۆما: پەنامێکـە لەخانـەی لـە بنـچينە (ڕەگـەز)ی تـۆڕە و ناوپۆش پێك هاتووە |
| Reticuloplasmocytom | ورم الخليـة البلازميـة الشبكية | پـەنامی پلازمـا و تـۆڕە خانـە، ڕەتيكيـو لوپلازمـا موسايتۆما: پەنامێکە تـۆڕە خانـە و پلازمـا خانـەی تێدايە |
| Reticulopod = reticulopodium | قـدم شـبكية كاذبـة: قـدم كاذبـة تـشبه خيـوط متضرعة | تـۆڕە پێـی درۆزنـە: گەنـدە پێيەکە لـە دەزولـەی لکدار دەچێت |
| Reticulosis | الداء الشبكي | تـۆڕە دەرد، زۆروونـی خانـەی تـۆڕە و ناوپۆشـی بارێکـە خـوێن ڕێژەيـەکی سـەدی خانـەی تـۆڕە و ناوپۆشی لـە ئاسايی زيـاتر تێدايە |

| | | |
|---|---|---|
| Reticulum | شبكية | تۆڕێکە:<br>١- تـــۆڕێکی پڕۆتـــۆپلازمی لەناو خانەکاندا<br>٢- تۆڕە شانە<br>٣- بەشـــی دووەمـــی ورگـــی کاوێژکەرانە |
| R., Chiali's | شبكية (شبكة) (جيارى) | تۆڕە (تۆڕیلە)ی (چیاری) |
| R., Ebner's | شبكية (ابنر) | تۆڕیلەی (ئێبنەر): تۆڕێکە لەخانـــە لـــەناو لوولـــە تومکێشەکاندا<br>(semimilerous fubules) |
| Retiform | شبكي | تۆڕەکی |
| Retina | الشبكية | تـۆڕە (ی چـاو): بـەرگی هـەرە نـــاوەوە و هەســـتەورترین پێکهـــــاتووی چـــــاوە، لەبلاوبوونـــەوەی دەمـــاری (چـاو) پێکهـاتووە و بەشـێکی زۆری پــــشتەوەی چــــاو دادەپۆشــێت، لـــە دە چـــین (تـۆی) پێکهـاتووە ناوەکانیـان بە ڕیز لە ناوەوە بۆ دەرەوە<br>١- پەردەی سنوور گری ناوەوە<br>the membrana limitans internal<br>٢- چینی ڕەگە ڕیشاڵ<br>(the nerve fibre layer )<br>٣- چینی گرێ خانەکان<br>ganglion cell layer<br>٤- چـــینە گەردیلـــەیی یـــان هۆنراوەیی ناوەوە<br>the inner molecular or plexiform<br>٥- چینی ناوکی ناوەوە |

| | | |
|---|---|---|
| R., Coarctate | تضيق الشبكية، الشبكية المتضيقة | تۆڕی تەسك: بارێكی وەك كۆڤك لێهاتووی تۆڕەیە لەبەر شلە (ئاو) چوونە نێوان چینی تۆڕە و چینی كۆڕۆیدەوە |
| R., Leopard | الشبكية المرقطة | تۆڕەی پەڵە پەڵە: تۆڕەیەكی بە دیمەن پەڵە پەڵەییە لەبەر تووشبوونی بە نەخۆشی (هەوكردنی ڕەنگكراوی تۆڕە) |
| R., Lower | الشبكية السفلية: النصف السفلي من الشبكية | تۆڕەی خواروو: نیوەی خوارووی تۆڕە |
| R., Nasal | الشبكية الانفية: النصف الداخلي (الأنفي) من الشبكية | تۆڕەی نزیك لووت: نیوەی نزیك لووتەوە (ناوەوە)ی تۆڕە |
| R., Temporal | الشبكية الصدغة | تۆڕەی لای جانگ: نیوەی لای دەرەوەی تۆڕە |
| R., Tigroid | الشبكية المخططة | تۆڕەی هێڵدار: تۆڕەیەكی هێڵدار یان پەڵە پەڵەیە لەبەر نەخۆشی |
| R., Upper | الشبكية العليا | تۆڕەی ژوورو: نیوەی ژووروی تۆڕە |
| Retinaculum | ضابطة قيد | ئەندامبەند:<br>١- پێكهاتوویەك كە ئەندامێك یان شانەیەك لە شوێنی خۆیدا ڕاگیر دەكات<br>٢- ئامرازێكە بۆ برینكاری (قۆڕی) كردن |

| | | |
|---|---|---|
| Retinal | شبكي | تۆڕەکی، تۆڕەیی، پەیوەندیدار بە تۆڕەی چاوەوە |
| Retintis | التهاب الشبكية | هەوکردنی (داگیرسانی) تۆڕە: هەوکردنێکی تۆڕەیە، نیشانەکانی کزبوونی بینایی (چاو تێکچوونی بینین، هەڵئاوسان و ئاوزانە ناوی تۆڕە یان هەندێ جار خوێن تێزانە ناوی |
| R., Albuminurica | التهاب الشبكية الزلالي | ئەلبومینە (هەوکردنی) تۆڕە ئەوەی لەگەڵ (هەوکردنی گورچیلە پەیدا دەبێت) |
| R., Diabetic | التهاب الشبكية السكري | شەکرە (هەوکردنی) تۆڕە: ئەو هەوکردنە تۆڕەیەی لەکاتی نەخۆشی شەکریدا دەبێت |
| R., Exudative | التهاب الشبكية النضحي | دادانە هەوکردنی تۆڕە، |
| R., Hemorrhagica | التهاب الشبكية النزفي | خوێنبەربوونە هەوکردنی تۆڕە: هەوکردنی تۆڕەیە خوێنبەربوونێکی زۆری لەگەڵدایە |
| R., Hypertensive | التهاب الشبكية الضغطي | پەستۆکە هەوکردنی تۆڕە: ئەوەی لەکاتی تووشبوونی نەخۆشیی تەوژمی خوێن بەرزیدا دەبێت |

| | | |
|---|---|---|
| R., Pigmentosa | التهاب الشبكية الصباغي | بۆیە هەوکردنی تۆڕە (ڕەنگدار): نەخۆشییەکە بە زۆری میراتییە (بۆماوەیە) بەرە بەرە تۆڕەی تێدا ڕەقترە هەڵدێت و لەگەڵ ڕەنگگرتن و پووکانەوە، کایەی بینینی تێدا تەنگ دەبێتەوە لەگەڵ چاوکزی (ڕۆژەکوێری) و خلتەی ئەستێرەیی نیشتن لەسەر تۆڕە و کوێربوونەوەی کونی خوێندانەکانی |
| R., Serous | التهاب الشبكية المصلي | سیرۆمە هەوکردنی تۆڕە: هەوکردنێکی سادەی چینەکانی سەرەوەی تۆڕەیە |
| R., Solar | التهاب الشبكية الشمسي | خۆرە هەوکردنی تۆڕە: لەبەر زۆر چاو بڕینە خۆر یان سەیر کردنی ڕۆژ پەید دەبێت |
| Retinoblastoma | ورم الجذيعات الشبكية | ڕەتینۆ بلاستۆما، ئاوسانی تۆڕە قەدۆکەکان |
| Retinochoroiditis | التهاب الشبكية والشمية | تۆڕە و هاوەل هەوکردن |
| Retinocytoma=Glioma of the retima | ورم الشبكية الدبقي | سرێشە تۆڕە ئاوسێ |

| | | |
|---|---|---|
| Retinodialysis | انفصال الشبكية | جوێ (جودا) بوونەوەی تۆڕە: لە شوێنی خۆ هەلّکەندرانی تۆڕە، هەلّپچڕانی تۆڕە لە ناوچەی کەناریەوە |
| Retinograph | صورة الشبكية | وێنەی تۆڕە، فۆتۆگرافی تۆڕە |
| Retinography | تصوير الشبكية | وێنەگرتنی تۆڕە، فۆتۆگرافگرتنی تۆڕە |
| Retinomalacia | تلين الشبكية | تۆڕە نەرمێ، نەرمبوونی تۆڕە |
| Retinopapillitis | التهاب الشبكية والحلمة | هەوکردنی (داگیرسانی) تۆڕە و مەمیلە: هەوکردنی تۆڕە و مەمیلەی چاو (otlie polilla) |
| Retionopathy | داء الشبكية | نەخۆشی (دەرد)ی تۆڕە: هەچ نەخۆشییەکی تۆڕە کە لە بنچینەوە لە (هەوکرنەوە) نییە |
| R., Exudative | داء الشبكية النضحي | دادانە دەردە تۆڕە |
| R., Leukemic | داء الشبكية الأبيضاضي | خوێنە سپیکە دەردە تۆڕە، دەردە تۆڕەی لو کیمیایی: بارێکە لە نەخۆشی لوکیمیادا ڕودەدات بەکالّبوونی بنکی چاو و ئاوسانی پەپکە و لێلّبوونی کەنارەکانی، دەردی تۆڕەی سپی خوێنی |

| | | |
|---|---|---|
| Retinoscope | منظار الشبكية | تـۆڕە بـین، ڕەتینۆسـکۆپ: ئامراز‌ێکـــە بـــۆ پـــێ سەیرکردنی تۆڕە |
| Retinoscopy | تنظير الشبكية | تۆڕە بیـنین: سـەیرکردن و بینینی تۆڕە بە تۆڕە بین |
| Retort | الأنبيق | ئـەنبیق: دەفرێکـی خـڕی مـــل درێـــژە بـــۆ کێـــشان (دڵۆپانـــــــدن) بـــــە کاردەهێندرێت |
| Retraction | انكماش، تبعيد، انحسار | چـوونەیەك، کرژبوونــەوە، دوورخـــــــــــستنەوە، دوورکەوتنــــــەوە، لادران، بردنە دواوە |
| Retractor | مبعد | دوور خـــەرەوە: ئامرازێکـــە بـــــۆ دوور خــــــستنەوەی لێواری برین یان داپچڕینی دەمی برین |
| R.,Emmet's | مبعد (إمت) | دوور خـــەرەوەی (ئێمێـــت): (کیلـــك بـــین: vaginal speculum)ێکی خۆ ڕاگرە واتـــا خـــۆ بـــەخۆی خـــۆی ڕادەگرێت لە ناو کێلکدا |
| Retrad | الى الوراء | بـــۆ دواوە، بـــۆ پـــشتەوە، بەرەو دواوە |
| Retrahena aurem | العضلة الأذنية الخلفية | پشتە ماسولکەی گوێ: ئـەو ماسـولکەیەی کـە گوێـچکە بەرەو پشتەوە ڕادەکێشێت |

| | | |
|---|---|---|
| Retro- | (خلف) سابق تدل على وضعية خلفية أو الى الخلف | پێشگرێکە بەمانای لە پشتەوە بوون، یان بەرەو پشتەوەیی |
| Retroaction | الفعل المعاكس | کاری پێچەوانە: کارکردن بە پێچەوانە (بۆ دواوە) |
| Retroauricular | خلف الأذن | پشت گوێ: پشت پەرەی گۆی |
| Retrobulbar | خلف القلة | پشت گۆی چاو |
| Retrocatheterism | القثطرة من الخلف: امرار قثطرة من فتحة فوق العانية عبر الأحليل الى فتحة الأحليل الخارجية | لە پشتە و کاسیتە ڕێکخستن: پیابردنی کاسیتەر (لوولەی لاستیك) بە ناو کونێکی کە لە بەر موسڵداندا کراوەتە میزڵدان و بۆ خوارتر بەناو میزەڕۆدا تا لە کونی میزی دەرەوە سەر دێنێتە دەرێ |
| Retrocecal | خلف الأعور | پشت کوێرە (ڕیخۆڵە) |
| Retrocedent | راجع، منسحب، مرتد | گەڕاوە، کشاوە دوا |
| Retrocervical | خلف العنق (الرحم) | پشت ملی مناڵدان |
| Retrocession | انسحاب | بە پشتا کەوتن، بۆ پشتەوە لادان بەتایبەتی بە پشتا کەوتنی گشتیی مناڵدان |
| Retrocolic | خلف القولون | پشت کۆلۆن، پشت ڕیخۆڵە گەورە |

| | | |
|---|---|---|
| Retrodeviation | انحراف خلفي | پـــشته لادان، بـــۆ پـــشتەوە لادان |
| Retrodisplacement | انزياح خلفي | بۆ پشتەوە لادان |
| Retroflexed | منثنى للخلف | بۆ پشتەوە چەماوە |
| Retroflexion | انثناء خلفي، ثنى خلفي | بۆ پـشتەوە چـەمانەوە، بـۆ پشتەوە چەماندنەوە |
| R. of the Uterus | انثناء الرحم للخلف | بـــۆ پـــشتەوە چـــەمانەوەی منالْدان |
| Retrognathia | ارتداد الفك | کاکیلـە گەڕانـەوە، چـەناگە لەپاشی |
| Retrograde | متقهقر | بۆ دواوە گەڕاوە: گەڕانـەوە دواوە، گەڕانـــــەوە لـــــە ڕێگایەکی پێشووەوە |
| Retrography = Mirror Writing | الكتابة المقلوبة، كتابة المرأة | ئـــاوەژو نووســـین، بـــە پێچەوانە نووسـین، ئاوێنـە نووسی |
| Retrogression | تقهقر | گەڕانەوە دوا، گەڕانەوە<br>١- دارزین، گەنین<br>٢- catabolism |
| Retroperitoneal | خلف البريتون | پشت پەریتۆن |
| Retrophryngeal | خلف البلعوم | پشت گەرو |
| Retropharynx | البلعـــوم الخلفـــي: القـــسم الخلفي من البلعوم | گـەرووی پـشتەوە: بەشـی پشتەوەی گەرو |

| | | |
|---|---|---|
| Retroposition | انتقال خلفي، ضجعة | پـــشته جـــوولان، فتگـــه و تلـوور کـەوتن، بــه دەمــدا کەوتن |
| Retropulsion | | بۆ پشتەوه ڕەتبردن:<br>١- بۆ پشتەوه پـاڵ پێوەنـان وەك سەری ساواوه لـەکاتی زاییـنـدا بـۆ ئـەوەی زیـان نەدات به گوڕ دەرپەڕین<br>٢- ڕەوت (gait)ێکـــــــــی نائاسـاییه تێـدا لـەش بـه پشتدا چەمیوەتەوه<br>٣- بـــۆ پـــشتەوه ڕۆیـــشتن (پاشــه و پــاش) وەك لــه هەنــدێ نەخۆشـــی ڕەگــدا (دەماردا) |
| Retrospection | نظرة الى الخلف | ئاوڕێـك بـۆ پـشتەوه: بـیر کردنـــــەوه لــــه ڕووداوی پێشوو |
| Retrospondylolisthesis = sacrolisthesis | هبوط العجز الخلفي، تقدم العجز | بـۆ پـشتەوه پاشـڵ (سمتــه جۆڵـــه) داخـــزان: سمتـــه جۆڵه (پاشڵ)ی داخزاو |
| Retrostalsis | الحركـة الدوديــة العكـسية، التحوي العكسي | کرمـه جووڵـەی پێـچەوانه (ی ڕیخۆڵه) |
| Retrosternal | خلف القصي | پشت کۆڵه (سنگ)ی |
| Retrovaccination | تلقـــيح عكـــسي (رجعـــي): تلقـــيح العجـــل باللقـــاح المستحصل من البشر وكـذلك تلقـــيح الأبقـــار بـــالفيروس المستحـصل مــن عجـل لقـح بالطريقة الذكورة اعلاه | کوتــانی ئــاوەژوو: کوتــانی گوێرەکه بەرما کوتەکـه لـه مــرۆڤ وەرگـیراوه هــەروەها کوتان به ڤایرەسی چێڵێك که لەوه پێش بـەو جـۆرەی سەرەوه کوترابێت |

| | | |
|---|---|---|
| Retroversion | ميل للخلف، انقلاب خلفي | بــۆ پــشتەوە وەرگــەڕان، وەرگەڕان بۆ پشتەوە |
| R. of Uterus | ميل الـرحم للخلف، انقلاب الرحم الخلفي | بــۆ پــشتەوە وەرگــەڕانی منداڵــــــدان، پــــــشتە هەڵگەڕانەوەی منداڵدان |
| Retzius Cavity | جوف (رتزيوس) | بۆشـایی (ڕیتزیـۆس)؛ ئـەو کــەلێن یــان بۆشــاییەی دەکەوێتە پێش میزڵدانەوە |
| R.'s Fibers | الياف (رتزيوس) | ڕیــشاڵەکانی (ڕیتزیــۆس)؛ تیسکە (دەزولە) ڕەقـەکانی خانــــەکانی دایتـــــەر (Deiters) لــە ئەنــدامی کۆرتی (organ of corti)دا |
| R.'s Ligament | رابط (رتزيوس) | بەستۆك |
| R.'s Space = prevesieals | حيز (رتزيوس) | کەلێن (ڕیتزیۆس) بۆشـایی بەردەمی میزڵدانە |
| R.'s Veins | اوردة (رتزيوس) | خـــوێنهێنی (ڕیتزیـــۆس)؛ خـــــوێنهێنی دیـــــواری ڕیخۆڵــەکان کــە دەچـــنە لقەکانی خوێنهێنی کلۆرەوە |
| Revaccination | اعادة (تكرار) التلقيح | کوتانەوە: کوتانی دووەم |
| Revellent | محول، مصرف | بگۆڕ، گۆڕە |
| Reversal | تحول | گــۆڕان: وەرگــەڕان یــان گـۆڕین بـە پێـچەوانە بـە شێوەی ئاوەژو |

| | | |
|---|---|---|
| R., Sex | تحول الجنس | تــوخم گــۆڕكێ، زايەنــدى (جــنس) گــۆڕان: گــۆڕانى تايبـــەتێكان (خـــەواس)ى زايەنديیەك (جنسێك) بـۆ هى زايەنديیەكەى تر |
| Reversible | حوول، قلوب | گـــــــۆڕۆك، بگـــــــۆڕ، هەڵدەگێڕێتــەوە: دەشــێت بە زنجيرە گۆڕانێكدا بڕوات بـە هـەموو سـەمتێكدا: بـۆ پێـشەوە يـان بـۆ پاشــەوە وەك كارلێـــك كردنێكـــى پێچەوانەيى كيميايى |
| Reversed | مقلوب، متحول، معكوس | ئاوەژو، پێچەوانە |
| Reversion | تحول | گۆڕان: گەڕانەوە سەر بارى پێشوو |
| Revilliod's Sign | علاقـــة (ريفيـــو): فقـــدان القـدرة علـى اغمـاض العـين الــتي في الجهــة المــشلولة (في الشلل النصفي) دون اغمـاض الأخرى ايضا | نيــشانەى (ريڤــەيێو): لــە شــەپلەى نيوەييــدا: پــەكى نوقاندنى چاوى لاى شەپڵە لێدراوەكە بە بێ نوقانـدنى ئــەوى تريــشيان واتــا بـــە تەنيا چاوى لاى شەپڵە كـە ناشێ بنووقێنرێت |
| Revive | يحي، ينعش | دەژێنێتـــــەوە، زينـــــدوو دەكاتـــەوە، بووژاندنـــەوە: هێنانــەوە ســەر ژيــان دواى وەك مـــردوو لێهـــاتن بـــە ڕواڵەت، هێنانـەوە سـەرخۆ (هۆش) |

| | | |
|---|---|---|
| Revivication | إنعاش، تجديد | بووژاندنەوە، نـوێ کردنـەوە: کڕاندن یـان نـوێ کردنـەوەی ڕووە ناسـاغەکە بـۆ ئـەوەی زووتر بە یەکترەوە بلکێنەوە (یەکتر بگرنەوە |
| Revulsion | تحويل: سحب الدم من جهة الى جهة أخرى | ئاڕاســتە کــردن: لــە بەشێکەوە خوێن ئاڕاستەی بەشێکی ترکردن |
| Rh | مختصر لـ(ريس) الذي هو نوع من النسانيس | ئــار ئــێچ کورتــەی (ڕێــسەس)ەکــە جــۆرە مەیمونێکە |
| Rh. Factor | عامل (ريس) | هۆکـاری ئـاڕ ئـێچ: کـارای ڕێسوس |
| Rhabditiform | عصوي، شبيه بالعصا | چیلکەیی، دار دەستی، وەك دار عەسا |
| Rhabdo-, | عـصوي (سـابقة) تـدل علـى العلاقـة بعـصا أو كـون الـشئ على شكل عصا | پێشگرێکە بەواتا چیلکە |
| Rhabdomyoblastoma | ورم جذعي عضلي مخطط | قــــەدە ئاوســــانێکی ماسـولکەیی میلـدارە، قـەدە پەنامی ماسولکەیی میلدار |
| Rhabdomyoma | ورم العضلة المخططة | پـەنامی ماسـولکە هێڵـدارە: رایــدۆمایۆما پــەنامێکی دانیــسقەی ماســولکەی هێڵدارەوە بە پەنامی پیس دادەندرێت بـەڵام هێنـدێك بە پیسی نـازانن بـەڵکو بـە باشی دادەنین (Benign) |

| | | |
|---|---|---|
| Rhabdomyomyxoma | | |
| Rhabdomyosarcoma | ساركوما العضلة المخططة | ڕابدۆ مایۆ سارکۆما: چەشنی پیسە لە ڕابدۆ مایۆما |
| Rhabdophobia | رهبة (رهاب) العصا | دارە ترسێ، لە دار ترسان: ترسێکی تەواو لێ نیشتن بە بینینی دار عەسا |
| Rhabdosarcoma | سركوما مخططة | سارکۆمای هێڵدار (میلدار) |
| Rhacoma | ١- سحجة<br>٢- ضفن متدل | ١- قرنجانی پێست<br>٢- گونشۆڕی: شۆڕیی تورەکەی گون (تورەکەی گون) |
| Rhaebocrania = torticollis = wryneck | صعر (العنق) | ملخواری |
| Rhaebosis | تقوس الأرجل: تقوس الأرجل أو اى عضو آخر مستقيم | قاچخواری، قاچ خواری، لاق گێڕی، گێڕی |
| Rhagadiform | مشقق | قڵیشاو، شەقار شەقار، قڵیش قڵیش |
| -rhage | نزف (لاحقة تعني نزف) | پاشگرێکە بەمانای خوێن بەربوون |
| Rhaphe = Raphe | رفو، رفاية، درز | دروونەوە |
| -rhaphy | خياطة، رفو، (لاحق) | پاشگرێکە بە مانای دروونەوە |

| | | |
|---|---|---|
| Rhazes | الرازي | ئەبوبەكری ڕازی |
| R.H.D.,=Relative Hepatic Dullness | كمد كبدي نسبي | شـــیبوونەوەی جگـــەریی ڕێژەیی، ڕێژە شیبوونەوەی جگەر |
| Rhembasmus | ١- شـرود الفكـر، اضـطراب عقلي<br>٢- تردد، حيرة | ١- بـــیر پـــەرتی، نـــاڕێكی هۆشەكی<br>٢- دوو دڵی، سەر سامی |
| Rheo-, | بادئـة بمعنـى دفـق، تيـار أو العلاقة بالتيار الكهربائي | پێـــــشگرێكە بـــــەمانای هەڵقوڵین، لۆزەو، تەزو یان پەیوەنـــدی بـــە تـــەزووی كارەباوە |
| Rheocord= Rheostat | المقاوم المتغير، ريوستات | ڕیۆسـتات، بـەرگری بگـۆڕ: دەزگایەكـە بـۆ ڕێكخـستنی تـــەزووی كارەبـــا بـــەهۆی بەرگری گۆڕاوەوە |
| Rheology | مبحــث الــسوائل: مبحــث جريان السوائل كجريان الدم خـــلال القلـــب والأوعيـــة الدموية | لـــوزەوزانی، تـــەوژمزانی، ڕیۆلۆجی: باس لە لـۆزەوی شـــلەمەنی دەكـــات وەك لۆزەوی خـوێن بـەناو دڵ و خوێندانەكاندا |
| Rheometer | ريومتر:<br>١- كالفانوميتر<br>٢- جهــاز لقيــاس ســرعة جريان الدم | لوزەوپێــــــــــــــو، تەوژمپێوڕیۆمیتەر<br>١- گلڤانۆ میتەر<br>٢- دەزگایـەك بـۆ پێوانـەی خێرایی لوزەوی خوێن |

